بەدەستە، هیچ کەسێك لەپێناوی خوادا بریندار نابێ – دیارە هەر خواش دەزانێ داخوا کێ لەرێی وی‌دا بریندار بووە – مەگەر رۆژی قیامەتێ ئەو کەسە دێ (خوێنەکەی) رەنگی خوێنەو بۆنیشی بۆنی میسکە).

**تێبینی**: هەرچەندە (النووي) گوتوویەتی: (والطريقة السَّديدة عندنا في تَرك الغَسْلِ انه غَيْرُ مُعَلل)[51] واتە: رێبازی راست لەلای ئێمە لەبارەی نەشۆردنی شەهیدەوە ئەوەیە کە لەحیکمەتی نەکۆڵینەوە! بەڵام وەك خاوەنی (المغني) گوتوویەتی:[52] دەگونجێ حیکمەتەکەی لانەچوونی ئەو شوێنەوارەی عیبادەتی جیهاد بێت کەشەرع بەپەسەندو باشی داناوە (.. والريحُ ريح المِسك)، وە دەگونجێ کەئەو نەشۆردرانە لەبەرئەوە بێ کەشەهید نوێژی لەسەر ناکرێ‌و مادام نوێژیشی لەسەر نەکرێ شۆردنی ناوێ، وە دەگونجێ لەبەر ئەوە بێ کە لەکات‌و گەرمەی جەنگ دا شۆردنی شەهیدان کەجاری وا هەیە زۆریش دەبن زەحمەت بێت.

منیش دەڵێم: دەشگونجێ لەبەر ئەم سێ حیکمەتە هەرسێکیان‌و گەلێکی دیکەش بێت‌و بەتەئکید بڕیارەکانی شەریعەتیش چ پەیوەندییان بەهەڵس‌وکەوتەکان (المعاملات)ەوە هەبێ، چ بەخواپەرستی‌یەکان (العبادات)ەوە پڕ پڕن لەحیکمەت‌و سوودو کەڵکی دنیاو دوارۆژ جا چ پەییان پێ ببرێ‌و بزانرێن، چ نەزانرێن!

شایانی باسیشە ئەوەی کە گوتمان‌و نەقڵمان کرد هەرچەندە لەبارەی شەهیدانەوە بوو بەگشتی – واتە شەهیدانی مەیدانی جەنگ – بەڵام هەندێك لەزانایان رایان وایە کەشەهیدی لەش پیس (مُجنُبْ) پێویستە هەر بشۆرێ، چونکە پێش شەهید بوونەکەی خۆشۆردن (غُسلْ)ێك قەرزدار بووە!

---

[51] (المجموع) ج٥ص٢٦٦.

[52] (المغني لابن قدامة) ج٢ص٣٣٣.

بەڵام زۆربەی هەرەزۆری زانایان ڕایان وایە کەشەهید هەرچەندە خۆشۆردنی لەش پیسی (جنابة)یش قەرزدار بوبێت هەر پێویست ناکات‌و، بگرە دروست نیە بشۆرێ[٥٣].

ئنجا ئەو فەرمایشتەش کە بەبەڵگەی دەهێننەوە هەرچەندە زانایانی فەرموودەناس (محدثين) مشت‌ومڕیان لەسەر کردەوەو (النووي) بەبێ‌هێز (ضعیف)ی دادەنێ[٥٤]، بەڵام ئەگەر ڕاست (صحیح)یش بێ، کەزۆربەی فەرموودەناسانیش بەڕاست (صحیح)ی دەزانن، ئەوە نەك هەر بەڵگەی شۆردنی شەهیدی لەشگران (مُجْنِبْ) نیە، بگرە بەڵگەی نەشۆرانیەتی، چونکە وەك (النووي) گوتوویەتی:[٥٥] (.. أنَّ الغسْلَ لَوْكان واجباً لما سقَط بِفِعْلِ الملائكة ولأمـَرَ النبي ﷺ بِغَسْلِه) واتە: ئەگەر هاتباو شۆردنی (شەهیدی لەشگران) فەرز بووایە ئەوە بەشۆردنی فریشتان لانەدەچوو و پێغەمبەر ﷺ فەرمانی‌دەکرد بەشۆردنی.

فەرموودەکەش[٥٦] بەکورتی ئەوەیە کەپێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی کوژرانی (حـَنظلة بن أبي عامر)دا خوا لێی ڕازیبێ بەدەستی (شداد بن الأسود) فەرموویەتی: (إنَّ صاحبكم تغْسِلُهُ الملائكـة) واتە: فریشتەکان هاوەڵەکەتان دەشۆن! جا کاتێك پرسیار لەهاوسەرەکەی (جميلة بنت أبي بن أبي سلول) - خوا لێی ڕازی بێ - دەکەن؟ دەڵێ: کاتێك گوێی لەدەنگە دەنگ بوو هاتە دەرێ‌و لەشگران بوو![٥٧]

---

[٥٣] ئەمە ڕای مالیکی‌یەکان جگە لە (سُحْنون) و زۆبەی شافیعی‌یەکان‌و (محمد) و (أبویوسف)ە لەحەنەفی‌یەکان، بڕوانە، (المجموع) للنووی ج٥ص٢٦٣.

[٥٤] سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ‌و لاپەڕە.

[٥٥] هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.

[٥٦] رواه الحاكم وصححه ورواه البيهقي وصححه الشيخ: عبدالقادر الارناؤوط.

[٥٧] خاوەنی: (الروض الانف) ج٣ص١٥٤، دەڵێ: ئەو ئافرەتە بووکی یەك شەوە بووە!

هەروەها ئافرەتیش لەکاتی بێنوێژیی (جنابة)دا جا بەهۆی جیماع یان حەیز یان زەیسانیی‌یەوە بێ لەلای زۆربەی زانایان هەرکات شەهید بوو هەمان حوکمی هەیەو نابێ بشۆرری، هەندێك لەزانایانیش دەڵێن: ئەگەر پێش شەهیدبوونەکەی خوێنی حەیز یان زەیسانیی‌یەکەی بڕا بێت‌و خۆی نەشۆرد بێت، پێویستە بشۆری، بەڵام ئەگەر لەحاڵەتی حەیزو زەیسانیی‌دا شەهید بووبێ ئەوە شۆردنی ناوێ[٥٨].

بەڵام لەڕاستیی‌دا ئەم ڕایە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی پشتگیریی ناکات‌و توانای خۆڕاگرتنی نیە لەبەردەم ئەو دەق‌و بەڵگە شەرعی‌یانەدا کەبەگشتی نەشۆررانی شەهیدان دەگەیەنن‌و حوکمی گشتی (الحکم العام)یش دروست نیە بەبێ بەڵگەی ڕوون‌و بێ چەندو چوونی شەرعی هیچی لێ تایبەت (تخصیص) بکرێ‌و هەڵباوێرری، وەك سەرجەم زانایانی (أصول الفقه) لەسەری یەکدەنگن[٥٩].

هەروەها منداڵی نابالغیش زۆبەی هەرەزۆری زانایان لەمالیکی‌یەکان‌و شافیعی‌یەکان‌و حەنبەلی‌یەکان، وە (محمد) و (ابو یوسف)یش لەحەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کەهەرکاتێك شەهید بوو نابێ بشۆرری، بەڵام (ابو حنیفة) دەڵێ دەبێ بشۆرری، بەڵام وەك (النووي)[٦٠] و (ابن قدامة)[٦١] گوتوویانە: فەرموودەکانی نەشۆردنی شەهیدان گشتیی (عام)ن‌و هیچ بەڵگەیەکیش لەسەر تایبەت کردنیان نەهاتوە بۆیە پێویستە بەسەر هەموو جۆرو ڕەگەزو تەمەنەکانی شەهیدان دا بچەسپێنرێن.

---

[٥٨] بڕوانە: (بدائع الصنائع للکاساني) وە: (تحفة الفقهاء للسمرقندي) ج١ص٢١١ وە: (المغني لابن قدامة) ج٢ص٤٠٢.

[٥٩] بڕوانە: (اصول الفقه المهمة) عبدالرحمن بن ناصر السعدی، ص ٨٣.

[٦٠] بڕوانە: (المجموع) للنووي، ج٥ص٢٢٦.

[٦١] بڕوانە: (المغني لابن قدامة) ج٢ص٤٠٣.

## ٢-چۆنیەتی کفن کردنی شەهیدان:

زۆربەی هەرەزۆری نیزیك بە یەکدەنگی زانایان ڕایان وایە کەشەهید پێویستە هەر بە بەرگ‌و پۆشاکی خۆیەوە بنێژرێ‌و نابێ وەك مردووان کفن بکرێ، جا ئێمە سەرەتا چەند فەرموودەیەك لەوبارەوە دێنین پاشان ئاماژەیەکیش بەڕای زانایان دەکەین:

لە (سنن ابي داود)دا هاتوە کە (عبدالله بن عباس) خوا لێیان ڕازی‌بێ گوتوویەتی: (**أمَرَ رسولُ الله ﷺ بِقَتْلى أُحدٍ أنْ يُنْزَعَ عَنْهم الحديدُ والجلودُ وأنْ يُدْفَنُوا بِدمائهم وثيابِهِمْ**) وحَسَّنهُ الشيخ عبدالقادر الارناؤوط.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کەکوژراوەکانی ئوحود ئاسنەواڵەو پێست‌و چەرمیان لێدابڕنرێ‌و بەخوێن‌و خورو پۆشاکەکانیانەوە بنێژرێن.

هەروەها (ابوداود) لە (جابر)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کەگوتوویەتی: (**رُميَ رَجُلٌ بِسَهْمٍ في صدره أو في حَلْقِهِ فمات، فَأُدْرِجَ في ثيابه كما هو..**) و حسنه الشيخ الالباني.

واتە: پیاوێك تیرێکی لەسینگی یان گەرووی دراو گیانی دەرچوو، جاوەك خۆی لەپۆشاکەکەی‌دا کفن کرا..

هەروەها (بخاري ومسلم) لە (خَبّاب)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە لەفەرموودەیەك کەتێیدا باسی کوژرانی (مصعب بن عمير) خوا لێی ڕازی بێ‌و چۆنیەتی کفن کردنی دەکات‌و دەڵێ:

(... **قُتِلَ يوم أحدٍ فَلَمْ نَجِدْ مانكَفّنهُ إلا بُرْدةً اذا غَطَّيْنا بها رأسَهُ خَرَجَتْ رِجلاهُ واذا غطَّينا رِجْلَيه خَرَجَ رَأسُهُ. فأمَرَ النبيُّ ﷺ أنْ نُغَطي رأسَهُ وأنْ نَجْعَلَ على رِجْلَيْهِ الأخرَ**)

واته: (مصعب بن عمیر) لەجەنگی ئوحوددا کوژراو هیچمان چنگ نەکەوت کەبیکەینە کفنو تێی وەرپێچین بێجگە لە عەبایەك، کەکاتێك سەریمان پێدادەپۆشی لاقەکانی دەردەکەوتنو کە لاقەکانیشمان دادەپۆشی سەری بەدەرەوە دەبوو! ئیدی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کەسەری داپۆشینو ئیذخیریش (کەجۆرە گیایەکی بۆنخۆشە) بخەینە سەر لاقەکانی.

جا هەرچەندە - بەڕێزان:- پاش ئەم فەرمایشتە ڕاستو ڕاشکاوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێویست بەقسەو ڕای هیچ کەس ناکات، بەڵام با بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی ئامـاژەش بەقسەی ژمارەیەك لەزانایانو پێشەوایانیش بکەین:

دەتوانین بڵێین: تێکڕای زاناو پێشەوایانی مەزهەبەکانی:

حەنەفی‌یەکان[٦٢]

مالیکی‌یەکان[٦٣]

شافیعی‌یەکان[٦٤]

حەنبەلی‌یەکان[٦٥]

زاهیری‌یەکان[٦٦]

لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەپێویستە شەهید چەكو چۆڵو بەرگو کەلوپەلی جەنگیو نائاسایی وەك: زرێو خوودەو چەرمو کەوڵو پێڵاو و خوفو گۆرەوی لێ‌دابرنرێو پاشان بەبەرگو پۆشاکی خۆیەوە دەنێژرێ.

---

[٦٢] (تحفة الفقهاء) للسمرقندي، ج١ص٢٠٩.

[٦٣] (الشرح الكبير للدردير) ج١ص٤٢٦.

[٦٤] (المجموع) للنووي، ج٥ص٢٦٣.

[٦٥] (المغني) لابن قدامة، ج٢ص٤٠٣.

[٦٦] (المحلى شرح المجلى) لابن حزم الاندلسي، ج٥ص١١٥.

## ٣-شەهیدان نوێژیان لەسەر ناکرێ

زۆبەو جەماوەری زانایانی ئیسلام ڕایان وایە کەشەهیدانی جەنگ وەك چۆن ناشۆررێن نوێژیشیان لەسەر ناکرێ، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێ کردووە.

کەمێکیشیان ڕایان وایە پێویستە وەك مردووان نوێژیان لەسەر بکرێ، هەندێکیشیان هەردووك لایان بەدروست داناون.

جا ئێمە بەکورتیو گوشراوی هەرسێك ڕایەکانو بەڵگەکانیشیان دەخەینەڕوو پاشان ڕای خۆشمانی لەبارەوە دەردەبڕین.

ڕای یەکەم: شەهیدان نوێژیان لەسەر ناکرێ

کە وەك گوتم ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانە بەڵگەیان ئەم فەرموودەیەیە کەڕاسترین فەرموودە (أصَحُّ حديث)یە لەبارەی نوێژکردنو نەکردن لەسەر شەهیدانەوە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ هاتبێو (بخاری) لە (جابر بن عبدالله) وە خوالێیان ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە لەبارەی شەهیدەکانی جەنگی ئوحودەوەیەو تێیدا هاتوە:

(... وأمَرَ بدَفْنِهِمْ في دمائهم، ولَمْ يُغسَّلُوا ولَمْ يُصلِّ عليهم)

واتە: .. وە (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمانی کرد کەبەخوێنەکەیانەوە بنێژرێن، وە نەشۆرران‌و نوێژیشیان لەسەر نەکرا.

وەك گوتیشمان ئەمە ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانە، بۆ وێنە:

لەمەزەبی مالیکی‌یەکان دا ئەمە هاتوە:[٦٧] (وقالَ مالك في الشهداء: مَنْ ماتَ في المعترك فلا يُغسَّلُ ولا يُكَفَّنُ ولايُصلَي عليه ويُدْفن بثيابه..) واتە: وە مالیك لەبارەی شەهیدانەوە گوتوویەتی: هەر کەسێك لەشەڕگەدا گیان

---

[٦٧] بڕوانە: (المدونة) الامام مالك، ج١ص١٨٣، وە: (قوانين الاحكام الشرعية) لابن جُزيّ، ص ١١٠.

بدات ئـەوە ناشۆرریّ و كفن نـاكریّ و نویّژیشـی لەسـەر نـاكریّ، وە بـە بەرگی خۆیەوە دەنیّژریّ..

وە لەمەزەبی شافیعیەكان دا گوتراوە: (... الشهيدُ لايجوزُ غَسْلُهُ و الصلاة عليه. وقال المُزني رحمة الله يُصليّ عليه.. والمذهَب ماسبق من الجزم بتحريم الصلاة والغسل جميعا، ودليله حديث جابر)

واتە: شەهید دروست نیە نەبشۆرریّ نە نویّژیشی لەسەر بكریّ، بەلاّم موزنی خوا لیّی خۆش بیّ گوتوویەتی: نویّژی لەسەر دەكریّ.. بەلاّم مەزەب (واتە ڕای ڕاستەقینەی مەزەبی شافیعی) ئەوەیە كە بەتەئكید هەم نویّژو هەم شۆردنیشی حەرامە، بەلّگەیشی فەرموودەكەی (جابر)ە.

وە لەمەزەبی حەنبەلیـەكانیش دا هـاتوە:[68] (... فأما الصَّلاةُ عليه فالصحيحُ انه لايُصلى عليه وهو قول مالك والشافعي وإسحاق..)

واتە: .. بەلاّم بۆ نویّژ لەسەركردنی ئەوە ڕای ڕاست ئەوەیە كەنویّژی لەسەر ناكریّ، وە ئەوە ڕای مالیك و شافیعی و ئیسحاقیشە...

## ڕای دووەم: شەهیدان پیّویستە نویّژیان لەسەر بكریّ

ئەم ڕایەش وەك خاوەنی (المغني) گوتوویەتی:[69] (.. وعن أحمدِ رواية أخرى انه يُصلى عليه إختارها الخلال، وهو قول الثوري وأبي حنيفة..)

واتە: وە ڕایەكی دیكەی ئەحمەد ئەوەیە كەنویّژ لەسەر شەهید دەكریّ خەللال[70] ئەو ڕایەی پەسەند كـردوە، وە ئـەوە ڕای سـوفیانی ثـەوری و ئەبوو حەنیفەشە.

لایەنگرانی ئەم ڕایـەش چـەند فەرموودەیـەك بـە بەلّگـە دیّننـەوە كـە لەهەموویان بەهیّزترو ڕاستتر – لەڕووی سەنەدەوە – ئەمەیە:

---

[68] (المغني) لابن قدامة، ج٢ص٤٠١.

[69] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

[70] (الخلاّل) یەكیّكە لەزانایانی بەرجەستەی مەزەبی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل.

(عن عقبة بن عامرٍ أن النبي ﷺ خَرَجَ يَوْماً فصَلَّى على أهْلِ أحدٍ صلاتَهُ على الميت، ثم إنصَرَفَ الى المنبر..) متفق عليه، واتـه: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك چووه دەرێ و نوێژی لەسەر خەڵكی جەنگی ئوحود كرد وەك نوێژی مـردوو، پاشان چووه سەر مینبەر..

## ڕای سـێیەم: نوێـژ لەسـەركردن و لەسـەرنەكردنی شـەهیدان هەردووكیان دروستن

ئەم ڕایەش هی هەندێك لەزانایانە كەیەكیان یان بەرجەستەترینیان (ابن حـزم الظـاهري)یە كە لـەوبارەوە گوتوویـەتی: (.. وإنْ صُلـيَ عليـه فَحسنُ، وإنْ لَم يُصلَّ عليه فَحَسَنُ)[٧١]، واتە: .. جا ئەگەر نوێژی لەسەر كرا (واتە شەهید) ئەوە باشەو، ئەگەر لەسەریشی نەكرا دیسان هەرباشە.

دیارە (ابن حَزْم)یش هەر ئەو فەرموودەیەی (عُقْبة بن عامر) بە بەڵگە دێنێتەوە، بەڵام ئەو ڕیوایەتـەی نا كە ئێمـە هێنامان بەڵكو ڕیوایـەتێكی دیكەی كەئەمەیە: (صَلَّى رسولُ الله ﷺ على قَتْلـى أُحُـدٍ بَعْـدَ ثمـاني سنين كالمُوَدعِ للأحياء والأمْوات ثمَّ طَلَعَ المنْبر..) رواه البخاري.

واتـه: پێغەمبـەری خـوا ﷺ دوای هەشـت سـاڵان نوێـژی لەسـەر كوژراوەكانی جەنگی ئوحود كرد، وەك خوا حافیزییەك لەزیندووان و كۆچ كردووان، پاشان چووە سەر مینبەرێ.

بەڵێ ئەمە بەكورتی و پوختی هەرسێك ڕایەكانی زانایانی ئیسـلامن لەبارەی نوێژ لەسەركردنی شەهیدانەوەو، منیش بەكورتی ئەمە بیروڕامە لـەوبارەوە كـەبێگومان لەبـەر تیشكی قسـەو باسـەكانی زانایـان دا دەیخەمەڕوو:



[٧١] بڕوانە: (المحلي شرح المجلى) ج٥ص١١٥.

(عن عقبة بن عامرٍ أن النبي ﷺ خَرَجَ يَوْماً فصلَّى على أهْلِ أحدٍ صلاتَهُ على الميت، ثم إنصرَفَ الى المنبر..) متفق عليه، واته: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك چووە دەرێ و نوێژی لەسەر خەڵكی جەنگی ئوحود كرد وەك نوێژی مردوو، پاشان چووە سەر مینبەر..

**ڕای سێیەم: نوێژ لەسەركردن و لەسەرنەكردنی شەهیدان هەردووكیان دروستن**

ئەم ڕایەش هی هەندێك لەزانایانە كەیەكیان یان بەرجەستەترینیان (ابن حزم الظاهري)یە كە لەوبارەوە گوتوویەتی: (.. وإنْ صُلّيَ عليه فَحسنٌ، وإنْ لَم يُصلّ عليه فَحَسَنٌ)[71]، واته: .. جا ئەگەر نوێژی لەسەر كرا (واتە شەهید) ئەوە باشە، ئەگەر لەسەریشی نەكرا دیسان هەرباشە.

دیارە (ابن حزم)یش هەر ئەو فەرموودەیەی (عُقْبة بن عامر) بە بەڵگە دێنێتەوە، بەڵام ئەو ڕیوایەتەی نا كە ئێمە هێنامان بەڵكو ڕیوایەتێكی دیكەی كەئەمەیە: (صَلّى رسولُ الله ﷺ على قَتْلى أحُدٍ بَعْدَ ثمانِي سنين كالمُودعِ للأحياء والأمْواتِ ثمَّ طَلَعَ المِنْبَر..) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای هەشت ساڵان نوێژی لەسەر كوژراوەكانی جەنگی ئوحود كرد، وەك خوا حافیزییەك لەزیندووان و كۆچ كردووان، پاشان چووە سەر مینبەرێ.

بەڵێ ئەمە بەكورتی و پوختی هەرسێك ڕایەكانی زانایانی ئیسلامن لەبارەی نوێژ لەسەركردنی شەهیدانەوەو، منیش بەكورتی ئەمە بیروڕامە لەوبارەوە كەبێگومان لەبەر تیشكی قسەو باسەكانی زانایان دا دەیخەمەڕوو:



[71] بڕوانە: (المحلي شرح المجلى) ج٥ص١١٥.

لەهەموویان ڕازی بێ - لەگەڵ هەموو دە کەسەکان دا بووە)، بەڵێ ئەم فەرموودەیەش ئەگەر گریمان لەڕووی زنجیرەی ڕاوییەکانیشەوە هیچ ئیشکالی نەبێ! ئەوە لەگەڵ فەرموودەکەی: (جابر)دا کە (بخاري) گێڕاویەتەوەو ڕاستترین فەرموودەیە لەوبارەوە، تێک دەگیرێ و دیارە لەبەرانبەریشیدا خۆی پێناگیرێ، مەگەر ئەویش وەك ئەوانی پێشوو وشەی (يُصلي)یەکەی بە (يدعو) تەفسیر بکرێ!

هـ- وە لەکۆتاییدا:

مادام لەو هەموو جەنگانەدا کە لەڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکانی و دوای وانیش، ئەنجام دراون و بەسەدان کەس کوژراوەو نەزانراوە نوێژ لەسەر کوژراوەکان کرابێت، کەبێگومان ئەگەر نوێژ یان لەسەر کرابایە بەشێوەی بەربڵاوو تەواتور پێمان دەگەیشت: بەڵێ لەبەر سەرجەم ئەو بەڵگانە ناچارین بڵێین: لەو سێ ڕایانە هەر ڕای یەکەم کەهی زۆربەو جەماوەری زانایانە ڕاست و دروستە.

## ٤-پێویستە شەهیدان لەشەڕگەی لێکوژرانیان دا بنێژرێن و نەگوازرێنەوە بۆ شوێنی دیکە.

زۆربەو جەماوەری زانایان ڕایان وایە کەدروست نیە جەنازەی شەهیدان لەشوێنی تێدا شەهیدکرانیان (شەڕگە) بگوازرێنەوە مادام نەگونجاو نەبێ بۆ بەخاك سپاردنیان، واتە ئەگەر شوێنەکە بەکەڵکی ئەوە نەدەهات کەبکرێ بەگۆڕ (قبر)، یان نێو ئاو بوو، دەتوانرێ لەو حاڵەتانەدا بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی دیکەی گونجاو، ئەگەرنا دەبێ جەنازەی شەهیدان هەر لەو شوێنەی شەڕەکەی لێ بووە یان دەوروبەری ئەو شوێنە بشاردرێنەوە.

ئەوەش بە بەڵگەی ئەم فەرموودانە: (عن جابر قال: لما كـان يـوم أُحـدٍ جاءَت عمَّتي بِأبي لِتَدْفَنَهُ في مَقابِرنا، فنادى مُنادي رَسُـولِ الله ﷺ رُدُّوا القَتْلـى الى مَضاجِعِـهِمْ)[٧٤] واتـە: جـابر دەڵـێ: لەجـەنگى (ئوحـود)دا پـوورم هـات جـەنازەى بابمى هێنايـەوە (بۆ مەدينـە) تـا لـەوێ لەگۆڕسـتانى خۆمـان بينێژێ، بەڵام جاڕ دەرى پێغەمبەر ﷺ بانگى كرد: جـەنازەكان بگێڕنـەوە بۆ شوێنى خۆيان.

كەواتە: بەفەرمانى پێغەمبەرى خوا ﷺ ئەو جەنازانـەش كە براونـەوە گێڕراونـەوەو ئـەوەبوو سـەرجەم شـەهيدەكانيان هـەر لـەدامێنى چيـاى (ئوحود) بەخاك سپاردن.

هـەروەها لـە فەرموودەيـەكى ديكـەدا هـەر (جـابر بـن عبـدالله) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (أنَّ النبيَّ ﷺ أمَرَ بِقَتْلـى أُحـدٍ أنْ يُـرَدُّوا الى مَصارِعِـهِمْ وكـانوا قَـدْ نُقِلـوا الى المَدينَـةِ)[٧٥] واتـە: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانى كـرد كەجەنازەى كوژراوەكانى جەنگى (ئوحود) بگێڕنەوە بۆ شوێنەكانى تێدا كوژرانى خۆيان، لەكاتێكدا كەهێنابوويياننەوە بۆ مەدينە.

(ابن القيم)يش هـەر لـەو بارەوەو لەسەر بناغـەى ئـەو فەرمايشتانەو سوننەتى كردەيى پێغەمبـەريى خـوا ﷺ گوتوويـەتى: (.. انَّ السُّـنةَ في الشُّهداءِ انْ يُدفَنُوا في مَصارِعِهِمْ ولايُنقَلُوا الى مَكانٍ آخَرَ)[٧٦] واتـە: ڕێبـازى پێغەمبەر ﷺ لەبارەى هەڵس‌وكەوت لەگەڵ جەنازەى شەهيدانەوە ئەوەيـە كـە لـەو جێيانـەدا كـەتێيان دا كـوژراون بنێژرێـن‌و نەگوازرێنـەوە بـۆ جێيەكى ديكە.

---

[٧٤] رواه الترمذي وأبوداود وصححه الالباني.

[٧٥] رواه النسائي وابن ماجة وصححه الالباني.

[٧٦] (زاد المعاد) بەرگى -٣- لاپەڕە ٢١٤.

شـايانى باسيشـه كه‌مه‌به‌سـتى (ابـن القيـم) له‌وشـه‌ى (السُـنة)دا، سوننه‌ته به‌ماناى زمانه‌وانى و ئه‌سڵيى خۆى، كه‌زانايانى فه‌رمووده‌ناس (مُحدثـين) لـه بـه‌كارهێنانى‌دا ڕه‌چـاوى ده‌كـه‌ن، كـه سـه‌رجه‌م ڕێبـازى پێغه‌مبه‌رى خوايه ﷺ نه‌ك بـه‌و مانـا زاراوه‌يى‌يـه‌ى شـه‌رعزانان (فقـهاء) كه‌بريتيه له: (تطوع و مندوب)!

واته: مه‌به‌ست له (سنة) لێره‌دا تێكڕاى ئيسلامه‌تى‌يه، نه‌ك سوننه‌تى به‌رانبه‌ر به‌فه‌ڕز.

پێويسته ئه‌وه‌ش بزانرێ – وه‌ك پێشتريش ئاماژه‌مان پێكردوه – كه ئه‌گه‌ر هات و ئه‌و شوێنانه‌ى شه‌هيدانى تێدا كوژراون بـۆ تێـدا بـه‌خاك سپێررانيان گونجاو نه‌بوون، بۆ وێنه: ئه‌گه‌ر له‌سه‌ربان يان جاده‌و ڕێو بان، يان نێو ده‌ريا بوو، ئه‌وه شتێكى ئاشكرايه كه‌ده‌بێ بگوازرێنه‌وه بـۆ جێ‌يه‌كى گونجاو و شياو.

هه‌روه‌ها كه‌ده‌شگوترێ: پێويسته كوژراوانى ڕێى خوا تبارك وتعالى له‌شوێنه‌كانى تێدا كوژرانياندا بنێژرێن مه‌به‌ست ئه‌وه نيه كه له‌خودى ئه‌و شـوێنانه‌دا بێـت و بـه‌موو لێيـان لانـه‌درێ! بـه‌ڵكو مه‌به‌سـت شـه‌ڕگه (ميدان المعركة)يه به‌گشتى، به به‌ڵگه‌ى ئه‌وه كه‌وه‌ك دوايى باسى ده‌كه‌ين پێغه‌مبه‌رى خوا ﷺ ڕێى داوه كه‌دوو شه‌هيد يان سێ شه‌هيد پێكه‌وه‌و له‌گۆڕێك دا بنێژرێن ده‌جا ئاشكراشه ئه‌و دوو سێ كه‌سه له‌يه‌ك شوێن دا نه‌كوژراون!

ئێسـتاش بـه‌چاكى ده‌زانم سـه‌رنجێكى قسـه‌و بـيروڕاى زانايـان بده‌يـن ده‌ربـاره‌ى گواسـتنه‌وه‌ى جـه‌نازه‌ى مـردووان به‌گشـتى و شـه‌هيدان به‌تايبه‌تى:

## أ- حەنەفیەکان:

لەکتێبی: (حاشیة ابن عابدین)دا هاتوە:[77] (.. ولا بـأسَ بِنَقْلِـهِ قَبْـلَ دَفنه، قیل مُطلقاً، وقیل الی مادون مُدَّةَ السَّفَر..) واتـە: وە گواستنەوەی (جەنازە) پێش بەخاك سپاردنی هیچی تێدا نیە، جا هەندێك گوتوویانە: بەموتڵەقیو، هەندێکیش گوتوویانە: بەمەرجێك لەماوەی سەفەر کەمتر بێت. واتە: (سەفەرێك کەدروست بێ نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە)[78].

ئەمە لەبارەی گواستنەوەی جەنازەی مردووانەوە بەگشتی، دەربارەی شەهیدانیش بەتایبەت، خاوەنی کتێبی: (السِیَر الکبیر وشرحُهُ)[79] گوتوویەتی پاش ئەوەی باسی ئەوەی کردوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە کەشەهیدان لەشوێنەکانی کوژرانیان دا بنێژرێن:

(وهذا حَسَنٌ ولَیْس بِواجِبٍ، وإنما صنعَ هذا رسول الله ﷺ لأنه کره المشقَّة علَیهِم..) واتە: وە ئەمـە باشـە بـەڵام فـەرز نیـە، وە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـەس لەبەرئەوە وای کردوە چونکە پێی ناخۆش بووە زەحمەتیان بدات.

## ب- مالیکیەکان:

مالیکیـەکان بەگشتی دەربارەی گواستنەوەی جەنازان گوتوویانـە، (ولا بأسَ أنْ یُنْقَلَ المیتُ مِنْ بلدٍ الی آخر أن کان لَمْ یُدْفَنْ)[80]

واتە: وە قەیدیێ ناکات کە جەنازە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگوازرێتەوە مادام نەنێژرا بێت.

---

[77] (حاشیة ابن عابدین) ج١ص٩٣٩.

[78] ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە خۆم هێناومە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.

[79] (شرح السیر الکبیر) ج١ص٢٣٤.

[80] (قوانین الأحکام الشرعیة) لأبن جزي، ص ١١٢.

ج- شافیعیەکان:

ئەمانیش وەك خاوەنی (مغني المحتاج) گوتوویەتی [81]، ڕایان بەم جۆرەیە، (يَحْرُمُ نَقْلُ الميت الى بلدٍ آخر وقيل يُكْرَهُ الا ان يكون مكة أو المدينة أو بيت المقدس نصَّ عليه الشافعي رضي الله تعالى عنه.. قال الزركشي: وينبغي آستثناءُ الشهيد..)، واتە: وە گواستنەوەی جەنازەی مردووان بۆ شوێنێکی دیکە حەڕامە، وە گوتراوە: ناپەسەندە مەگەر بۆ مەککە یان مەدینە یان بەیتولمەقدیس بێت.. زەرکەشی گوتوویەتی: بەڵام پێویستە شەهیدان لەم حوکمە هەڵباوێررێن. (واتە لەوەدا کەگواستنەوەی جەنازە بۆ ئەو سێ شوێنە دروستەو قەیناکات) [82].

د- حەنبەلیەکان:

ڕای ئەمانیش (ابن قدامة) ئاوا ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێ: [83] (يُسْتَحبُّ دَفْنُ الشهيد حَيْثُ قتل، قال احمد: أما القَتْلى فعلى حديث جابر.. فأما غيرهم فَلا يُنْقَلُ الميتُ مِنْ بَلَدِهِ الى آخر إلا لغرضٍ صحيح.. قال أحمد: ماأعلم بنقل الرجل يموت في بلده الى بَلَدٍ آخر بَأسا).

واتە: وا پەسەندە شەهید لەکوێ کوژراوە لەوێش بشاررێتەوە، ئەحمەد گوتوویەتی: بەڵگەی بەوجۆرە ناشتنی شەهیدان فەرمایشتەکەی (جابر)ە، بەڵام غەیری ئەوان ئەوە دروست نیە مردوو کە لەشوێنی خۆی دەمرێ بۆ جێیەکی دیکە بگوازرێتەوە مەگەر ئامانجێکی ڕەواو شەرعی هەبێت.. ئەحمەد گوتوویەتی: نەمزانیوە گواستنەوەی بابایەك کە لەوڵاتی [84] خۆی دەمرێ بۆ وڵاتێکی دیکە هیچی تێدا بێت.

---

[81] (مغني المحتاج) ج١ص٣٦٦.

[82] ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە خۆم زیادم کردوە بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست.

[83] (المغني لأبن قدامة) ج٢ص٣٨٩، ٣٩٠.

[84] مەبەست لەوڵات (شوێن)ە بەگشتی، نەك مانا عورفی و سیاسیەکەی ئەم ڕۆژگارەی.

ئەمە بەکورتی و پوختی ڕای زانایان بوو لەبارەی گواستنەوەی جەنازانەوە بۆ ناشتنیان لەشوێنی خۆیانەوە کە گیانیان تێدا سپاردوە بۆ شوێنێکی دیکە بەگشتی و، گواستنەوەی جەنازەی شەهیدانەوە بەتایبەت.

جا ئەوەی دەردەکەوێ ئەوەیە کە بۆ ناشتنی مردووان لەشوێنی خۆیان یان گواستنەوەیان، بەڵگەیەکی وا نیە کەجێی پشت پێبەستن بێت بۆ ڕێگرتن لەگواستنەوەی جەنازەی مردووان، هەرچەندە بێگومان زوو بەخاك سپاردنی مردووان شتێکی پەسەندە ئەگە فەرزیش نەبێ، وەك (أبوداود) لە (سنن)[٨٥] ەکەی داو لەژێر ناوونیشانی: (باب: التعجيل بالجنازة وكراهية حَبْسِها)دا ئەم فەرموودەیەی هێناوە: (عن الحصين بن وَحْوَحْ رضي الله عنه أن طلحة بن البراء مَرِضَ فأتاه النبي ﷺ يعودُهُ فقال، إني لاأرى طلحة إلا قَدْ حَدَثَ فيه الموتُ، فآذِنوني بهِ، وعَجِّلُوا، فأنَّه لاينبغي لجيفة مسلمٍ أن تحبس بين ظهراني أهْلِه)

واتە: (طلحة بن البراء) نەخۆش کەوت و پێغەمبەر ﷺ سەردانیکرد، فەرمووی: من پێم وایە تەڵحە مەرگی پێوە دیارە، جا (هەرکات مرد) بەپەلە ئاگادارم بکەنەوە لێی، چونکە نابێ لاشەی مسوڵمان لەنێو کەس وکاریدا بهێڵرێتەوە.

بەڵام بۆ شەهیدان ئەوە مادام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بەناشتنی شەهیدانی جەنگی ئوحود لەشوێنی کوژرانیان دا، وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوە بەڵگەی پێویست بوونی بەخاك سپێررانیانە لەشەرگەکانیان دا، چونکە بێگومان وەك زانایانی (أصول الفقه)

---

[٨٥] بڕوانە: (مختصر سنن ابي داود) ص ٤٥٧، رقم الحديث: ٣١٥٩.

گوتوویانه:[٨٦] (إنَّ صيغة الأمر إذا وَرَدتْ مطلقةً عَريةً عنِ القرائن تكون حقيقة في الطَّلَب وحقيقة في الوجوب) واته: صیغەی فەرمان هەر کاتێك بەموتڵەقی هاتو هیچ نیشانەیەکی لەگەڵ نەبوو کەماناکەی بگۆڕێ، ئەوە وەك حەقیقەت داواکردن و فەرزبوون دەگەیەنێ؛ دەجا بێگومان (ردوا القتلی)ش کە لەفەرموودەکەی (جابر)دا هاتوە بەوجۆرەیە.

## ٥-لەکاتی ناچاریدا دروستە شەهیدێك زیاتر بخرێنە گۆڕێکەوە

زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کەلەکاتی ناچارییدا دروستە لەشەهیدێك زیاتر لەگۆڕێکدا بشاردرێنەوە.

ئەویش بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (عن هشام بن عامر، قال: شَكَوْنا الى رَسولِ الله ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ، فَقُلْنا: يارسولَ الله! الْحَفْرُ عَلَيْنا لكُلِّ إنسانٍ شَديد، فقال رَسول الله ﷺ إحْفِروا، وأعْمِقوا، وأحْسِنوا، وأدفِنُوا الأثنين والثلاثة في قبرٍ واحدٍ، قالوا: فمَنْ نُقَدِّمُ يا رسولَ الله؟! قال: قَدِّموا أكْثرُهُم قُرآناً، فكانَ أبي ثالثُ ثلاثةٍ في قَبْرٍ واحدٍ)[٨٧] واتە: هیشامی کوڕی عامیر دەڵێ: لەجەنگی (ئوحود)دا سکاڵامان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا هەموو ئینسانێك قەبرێکی بۆ هەڵقەنین تووشی ناڕەحەتیو ماندووبوونی زۆر دەبین!، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: گۆڕەکان هەڵقەنن، وەقووڵیان بکەن، وەڕێكو پێکیان بکەن، وە دوو دوو و سێ سێ بیانخەنە گۆڕێکەوە،

---

[٨٦] بڕوانە: (الأحكام في أصول الأحكام) الآمدي، ج٢ص١٥٩، ١٦١، ١٦٢.

[٨٧] رواه النسائي وصححه الالباني، (صحيح سنن النسائي) ج٢ص ٤٣٢، رقم: ١٨٩٩.

**گوتیان کامەیان پێش بخەین؟! فەرمووی: ئەوەیان کەقورئانی زیاتر لەبەرە، (هیشام دەڵێ): باوکم سێیەم کەس بوو کەهەرسێکیان بەیەکەوە خرانە گۆڕێکەوە.**

**دیارە هەر لەسەر بناغەی ئەم ئاڕاستە (توجیە)یەی پێغەمبەری خواش بووە کەهەمیشە مسوڵمانان لەجەنگەکانیانو لەکاتی ناچاریی‌و کەم بواریی‌و گرفتاریی‌دا زیاتر لەکوژراوێکیان خستۆتە گۆڕێکەوە، بۆ وێنە: لە (سنن: سعید بن منصور)[88]دا هاتوە کەمسوڵمانان لەجەنگی (مؤتة)دا هەرسێك فەرماندە شەهیدەکەی ئەو جەنگەیان پێکەوە خستوونەتە گۆڕێکەوە، کە (زید بن حارثة) و (جعفر بن ابي طالب) و (عبدالله بن رواحة) بوون خوا لێیان ڕازی بێت.**

**هەروەها لە (المغني)دا[89] هاتوە کە (احمد بن حنبل)یش کە لەو بارەوە پرسیاری لێکراوە هەر بەوجۆرە فەتوای داوە.**

**حیکمەت‌و بەرژەوەندی‌یەکیش کە لەو مۆڵەتەدا هەیە لەهیچ کەس شێرراوە نییە، بەتایبەت کەسانێك کە ئەو حاڵەتە سەغڵەتی‌یانەیان هاتوونە ڕێ‌و بەکردەوە بەشداری جەنگ‌و جیهادیان کردوە!**

---

[88] بڕوانە: (سنن: سعید بن منصور) ج٢ص٢٩٨، رقم: ٢٨٣٥.

[89] بڕوانە: (المغني لابن قدامة) ج٢ص٤٢٢.

## خاڵی پێنجەم: ئەركی سەرشانی كۆمەڵو دەوڵەتی ئیسلامیی بەرانبەر بەخێزانو كەسوكاری شەهیدان

پاش ئەوەی لەچوار خاڵی ڕابردوودا بۆمان ڕوون بۆوە كەشەهید كێیەو چ پلەو پایەیەكی هەیەو شەهیدان چەند جۆرنو، چۆن چۆنی مامەڵەو هەڵسوكەوت لەگەڵ جەستەی شەهیدان دا دەكرێ؟! جێی خۆیەتی ئەمجار بزانین داخوا مسوڵمانان چ لەشێوەی كۆمەڵو كۆمەڵگایەك دابنو چ لەشێوەی دەوڵەتێك دا چ ئەركو بەرپرسیارێتییەكیان بەرانبەر بەمنداڵو خێزانو دایكو بابو كەسوكاری شەهیدان لەسەر شانە؟!

جا ئێمە خوا یاربێ لەحەوت بڕگەی چڕوپڕدا باسی چۆنیەتی جێبەجێكردنی ئەو ئەركی سەرشانو وەفادارییەی ئوممەتو دەوڵەتی ئیسلامیی دەكەین بەرانبەر بەخێزانو كەسوكاری شەهیدانی سەربەرزی ئیسلام:

**١- بەتەنگەوەبوونو نەمیەت دان بەكۆڕانی شەهیدانو دەربڕینی هەستو نەستو هەڵوێستی بەپەرۆشانە:**

بەڵێ ئەوە یەكەمینو سەرەتاییترین هەقو مافی خێزانو كەسوكاری شەهیدانە لەسەر مسوڵمانان، چونكە بێگومان هەرچەندە شەهیدیی پلەو پایەیەكی یەكجار بەرزو ناوازەیە بەڵام دیسان خێزانو بنەماڵەو كەسوكاری هەر ناڕەحەت دەبن، بۆیە پێویستە مسوڵمانانیش بەهەستو نەستو هەڵوێستی بەپەرۆشانەوە بەشدارییان بكەنو

کەس‌وکارو بنەماڵەکەی بزانن کە ئەو شەهیدە تەنها هی ئەوان نیەو بەس لەوان نەڕۆیشتووە!

ئـەم بەسـەرهاتەش باشـترین بەڵگەیـە لـەو بـارەوە، کـەبێگومان لوێچێکیشە لە تەغارێك:

(عَطاء بن يَسار) دەگێڕێتەوە[٩٠] کە ڕۆژێکیـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ (کە وادیارە هەر ئەو ڕۆژە بووە کە لەجەنگی ئوحود گەڕاونـەوەو حـەمزەی مـامی خـوا لێـی ڕازی بێ تێیدا شـەهید کـراوە) بـەلای ئافرەتـانی (بـني الأشْهَلْ) تێپەڕی - کە لەجەنگی ئوحود بوو بوونەوە - بیستی کە بۆ ئەو خزمانەیان دەگریان کە لە ئوحود شەهید بووبوون، جا پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی: (ولكن حَمْزَةُ لابَواكي لَـهُ) بەلاّم هیچ ئافرەت نین بۆ حـەمزە بگریەن)[٩١] (سعاد بن معاذ)یش گوێی لەو قسەیەی بوو، بۆیە چوو بۆلای ئافرەتانی - تیرەی - (بَني الأشهل) و پێـی گوتن کەبچنە ماڵی حەمزەو بۆی بگریـەن! ئیدی چوون‌و دەستیان کرد بەشین‌و گریـان، جـا کـاتێك پێغەمبـەری خـوا ﷺ گریانەکەی بیستن، پرسـی: ئەوانـە کێـن؟! گوتـرا: ئافرەتانی ئەنصارین کە لەسەر حەمزە دەگریەن، پێغەمبـەریش چـووە لایان‌و فەرمووی: مەگریـەن خوا لێتـان ڕازی بێ، وە لەمنداڵـەکانتان، وە لەمنداڵی منداڵەکانیشـتان، وە لەڕیوایـەتێك دا هـاتوە کـە فەرموویـەتی: مەبەستم ئەمە نەبوو، وە شین کردنیشی قەدەغەکرد...



[٩٠] بڕوانە: (سنن سعيد بن منصور) ج٢ص٣٢٥، ٣٢٦، رقم، ٢٩١٠.

[٩١] چونکە (بني هاشم) کەخزمانی حەمزە بوون بەزۆری لەمەککە بـوون‌و حـەمزە کۆچکەر (مُهاجِرْ) بوو!

## ٢-سەرەخۆشی لێکردنی خێزان و کەس وکاری شەهیدان:

ئەمیش ئەرکێکی گەورەو گرنگەو نابێ بەکەم بگیرێ و فەراموش بکرێ، چونکە بابای خاوەن بەلا (الشخص المُصاب) هەرکەسێکی بێت پێویستی بەدڵدانەوەو خەم ڕەوێنران هەر هەیە، جا لەو بارەشەوە لەسیرەی پێغەمبەری خوادا ﷺ نموونە زۆرن بەلام ئێمە بەیەکیان واز دێنین:

(الشعبي)[92] گێڕاویەتەوە کەکاتێك هەواڵی کوژرانی (جعفر بن أبي طالب) بەپێغەمبەری خوادا ﷺ گەیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەژنەکەی (أسْماء بنت عُمَيْس) گەڕا هەتا تەواو گریاو فرمێسکی ڕشت و تۆزێك پەژارەی کەم بۆوە، ئەوجار هاتەلای و سەرەخۆشی لێکرد، وە کورەکانی جەعفەری بانگ کردو بۆیان پاڕایەوە، وە دووعای بۆ (عبدالله بن جعفر) کرد کەدەستی پڕ بەرەکەت بێت، جا هەر شتێکی کڕیبایە قازانجی لێدەکرد، ئنجا ئەسماءگوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوانە پێیان وایە کەئێمە لەڕیزی کۆچکەران (مهاجرين)دا نین! ئەویش فەرمووی: (كَذَبُوا لكم الهِجْرَةُ مَرَّتين هاجرتم الى النجاشي وهاجَرْتُمْ اليَّ) واتە: ڕاست ناکەن ئێوە دوو کۆچتان هەن، چونکە بۆلای نەجاشیش کۆچتان کردوەو بۆلای منیش!



[92] بڕوانە: (مُصَنف ابن ابي شيبة) ج١٤ ص٥٢٠، ٥٢١، وە (فتح الباري) ج٧ص١٨٨.

## ٣-چاودێری كردن و بەسەركردنەوەی خێزان و كەس وكاریان و پێ لێ نەبڕینیان:

بەڵگەو نیشانەیەكی دیكەی وەفاداریی مان بۆ شەهیدانی سەربەرزمان ئەوەیە كە بەگوێرەی تواناو بۆ لوان سەردانی خێزان و بنەماڵەیان بكەن و هەواڵیان بپرسین، لەوبارەشەوە نموونە لەسیرەی پێغەمبەری پێشەوامان دا ﷺ زۆرن كەئەمە یەكێكیانە:

(بخاري ومسلم) لە (انس بن مالك)ەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە كە گوتوویەتی:[٩٣] پێغەمبەر ﷺ بێجگە لەماڵی خێزانەكانی هێندەی دەچووە ماڵی (أم سُلَیْم) نەدەچووە ماڵی هیچ كەس، جا لەوبارەوە پرسیاری لێكرا، ئەویش فەرمووی: (إني أرحَمُهما، قُتِلَ أخوها معي)من بەزەییم پێیدا دێتەوە چونكە برایەكەی لەگەڵ من بوو كوژرا.

## ٤-دەست بەسەری منداڵەكانیان داهێنان و مشوور لێخواردنیان:

ئەمیش شێوەیەكی دیكەی گرنگی وەفادارییە بۆ شەهیدانی ڕێی خوا چونكە ئەو كەبۆ خۆی ڕۆیشتووە خێزان و منداڵەكانی بەئەمانەت بەسەر مسوڵمانان دا بەجێ هێشتوەو، ئەمانەتیش پێویستە پارێزگاریی لێبكرێ.

دیارە لەو بارەشەوە دەتوانین گەلێك نموونان لەژیان و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەكانی (ابوبكرو عمرو عثمان و علی) خوا لێیان ڕازی بێ بێنینەوە، بەڵام تەنها بەم نموونە دڵبزوێنە واز دێنین:

---

[٩٣] بڕوانە: (فتح الباري) ج٦ص٥٠، وە: (شرح صحیح مسلم للنووي) ج٩ص٢٦٥.

(إبن ابي شيبة)[94] گێڕاویەتەوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای هاوسەری جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب دڵی دایەوە پاشان فەرمووی: (إدعي لي بَني أخي) برازاکانم بۆ بانگ بکە! دەڵێ: جا ئەسماء سێ کوڕی گچکەی هێنان دەتگوت بێچووە باڵندەن، ئنجا پێغەمبەر ﷺ سەرتاشی بانگ کرد سەری تاشین، ئەوجار فەرمووی: هەرچی (محمد)ە وەك (ابو طالب)ی مامان دەچێ، (عَوْن)یش ڕواڵەت و ڕەوشتی وەك من دەچێ، بەڵام (عبدالله) ئنجا دەستی گرت و دەستی بەرزکردەوە، پاشان فەرمووی: (أللهمَّ بارِكْ في صفقة يمينه) خوایە دەستی بەبەرەکەت بکە! دەڵێ: ئیدی دایکیان پێیان خۆشحاڵ بوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: (لَم تخْشَيْن عليهم الضيقة وأنا وليهمْ في الدنيا والآخرة؟!) ئایا دەترسی زایە بن، لەحاڵێك دا کەمن لەدنیاو دوارۆژدا سەرپەرشتیاریانم؟!

## ٥-یادکردنەوەی شەهیدان بەخێرو چاکە:

لەوبارەشەوە کەنموونە زۆرن بەیەکێکیان واز دێنین:

(ابن ابي شَيْبَة)[95] لە (واقد بن عمرو بن سعد بن معاذ)ەوە خوا لێیان ڕازی بێ کەنەوەی (سعد بن معاذ)ە دەگێڕێتەوە کەگوتوویەتی: چوومە لای (انس بن مالك) گوتی: تۆ کێی؟ گوتم: من (واقد بن سعد بن معاذ)م، گوتی: خوا لەسەعد خۆش بێت بێگومان زۆر شێوەی سەعد دەکەی، پاشان گوتی: خوا لەسەعد خۆش بێ لەجوانترین و باڵا بەرزترینی خەڵکی بوو، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی بۆ (أكَيْدرَ) پادشای (دومة) نارد، ئەویش لەبەرانبەرو لەوەڵامیدا (وێڕای نامە) جوببەیەکی

---

[94] (مُصنَّف ابن ابي شيبة) ج١٤ص٥١٨، رقم: ١٨٨٢٠.

[95] سەرچاوەی پێشوو، ج١٤ ص ٤١٣، رقم: ١٨٦٤٤

ئاوریشمی بەزێر چنراوی بۆ ناردبوو، جا خەڵکی دەستیان لەو جوببەیە دەداو پێی سەرسام (مُعْجَبْ) بوون، ئەویش فەرمووی: پێی سەرسامن؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا هەرگیز بەرگی لەوە جوانترو چاکترمان نەبینیوە! ئەویش نەرمووی: دەجا سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە دەستەسڕەکانی (سعد بن معاذ) لەبەهەشتێ لەوەی کەدەیبینن چاکترە!

## ٦-سەردانی گۆڕەکانیان و دووعای خێر بۆ کردنیان:

ئەمیش بەڵگەو نیشانەیەکی دیکەی گرنگی وەفاداریی مسوڵمانانە بۆ شەهیدەکانیان و لەوبارەشەوە نموونەو بەڵگە لەسیرەو ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ زۆرن، ئێمە تەنها دووانیان لێ باس دەکەین:

**أ**-(ابن کثیر) لە (عبدالله بن عمرو بن العاص) و ئەویش لە (أبو مُوَیْهِبَة)ی غولامی پێغەمبەری خواوە ﷺ هێناویەتی، کە گوتوویەتی:[96] شەوێکیان لە نیوەشەوێدا پێغەمبەری خوا لەدوای ناردمو فەرمووی: ئەی (أبا مُوَیْهِبَة) من فەرمانم پێکراوە کەداوای لێبوردن بکەم بۆ خەڵکی[97] (بقیع)، جا لەگەڵم وەرە، منیش لەخزمەتی دا چووم، جاکاتێك لەنێوەڕاستیان دا وەستا، فەرمووی: (السلام علیکم یا أهل المقابر) سەلامتان لێبێ ئەی خەڵکی گۆڕستان...

**ب**- (البغوي)[98] هێناویەتی کەپێغەمبەری خوا ﷺ وەك (عقبة بن عامر الجُهَني) گێڕاویەتەوە پاش هەشت ساڵان دووعای بۆ کوژراوەکانی ئوحود کرد وەك ماڵئاوایی‌کردن لەزیندووان و کۆچ کردووان...



---

[96] بڕوانە: (البدایة والنهایة) لأبن کثیر، ج٥ص٢٥

[97] (بقیع) ئەو گۆڕستانەیە کەلەنیزیك مزگەوتی پێغەمبەری خوایە لەشاری مەدینەو گۆڕی ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی بەرێزی لەشەهیدان و مردووانی تێدایە.

[98] بڕوانە: (شرح السنة) للبغوي، ج١٤ ص ٣٩.

دیاره ئەم فەرموودەیەمان پێشتریش هێناو (بخاري ومسلم)یش گێڕاویانەتەوە.

جا ڕەنگە یەکێك لەبارەی بڕگەی (٥، ٦)ەوە پرسیارێکی بۆ دروست بێ چونکە بەڕواڵەت هیچ پەیوەندییان بەخێزانو کەسوکاری شەهیدانەوە نیە! بەڵام لەڕاستیدا وا نیەو کەسوکاری شەهیدان، چ هاوسەر چ کوڕو کچ چ باب و دایك.. هتد زۆر دڵخۆشو شادمان دەبن کەهەست بکەن مسوڵمانان شەهیدەکەیانیان فەرامۆش نەکردوەو یادی خێری دەکەنو سەلام لەگۆڕەکەی دەکەنو دووعای خێری بۆ دەکەن! وە بەدەردی عارەب گوتوویانە: (مَنْ جَرَّبَ مِثْلَ تَجربتي عَرِفَ مِثْلَ مَعْرِفتي).

## ٧-مشوورلێخواردنی خێزانی موجاهیدان بەگشتیو شەهیدان بەتایبەت لەڕووی بژێوو گوزەرانەوە:

سەرجەم شەرعزانان لەکتێبو سەرچاوەکانیان باسی ئەو مەسەلەیەیان بەوردیو گرنگی پێدانەوە کردوەو ئێمە بۆ نموونە تەنها چەند دێڕێك لەدووان لەو سەرچاوانە نەقڵ دەکەین:

أ-خاوەنی (المهذب) لەوبارەوە گوتوویەتی:[٩٩] (وينبغي للأمام أن يَفتح ديواناً يُثْبِتُ فيه أسماء المقاتلهِ وقدْر أرزاقهم ويُستحبُّ أن يجعل على كل طائفةٍ عَريفاً، لأن النبي ﷺ جعل عام خيبر على كل عشرة عريفاً.. ويَقْسِمُ بينهم على قدر كفايتهم لأنهم كفوا المسلمين أَمْرَ الجهاد فوَجَبَ أن يكفوا أمرَ النفقة ويتعاهَدُ الأمامُ في وقت العطاء عَدَدَ عيالِهِمْ لأنه قد يزيدُ ويَنْقُصُ..).

واتە: وە پێشەوای مسوڵمانان لەسەری پێویستە کەدیوانێك دابنێ ناوو ئەندازەی بژێوی جەنگاوەرانی تێدا تۆمار بکات، وە وا باشە کەلەسەر هەر کۆمەڵێك بەرپرسێك دابنێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ ساڵی گرتنی خەیبەر لەسەر

[٩٩] بڕوانە: (المهذب) للشيرازي، ج٢ص٢٤٨، ٢٤٩.

هەر دە کەس بەرپرسێکی دانا بوو.. وە دەبێ بەپێی پێویستییان بژێویان بەسەردا دابەش بکات، چونکە مادام ئەوان ئەرکی جیهادیان لەکۆڵ مسوڵمانان کردۆتەوە، پێویستە ئەوانیش ئەرکی مەسرەف کێشانیان لەکۆڵ بکرێتەوە، وەدەبێ پێشەوای مسوڵمانان لەکاتی یارمەتی پێدانیان دا ژمارەی خێزانیان بەسەر بکاتەوە چونکە کەم و زیاد دەکەن...

ب- هەروەها خاوەنی (المُغني)ی لەوبارەوە گوتوویەتی:[100] (.. ويَعْرِفُ قَدْرَ حاجتِهِمْ يعني: اهل العطاء وكفايتهم، ويزداد ذو الولَد من اجْلِ وَلَدِهِ وذو الفرس من اجْلِ فَرَسِهِ.. وينظر في اسعارهم في بُلدانِهِمْ، لأن اسعارَ البُلدانِ تَختلفُ والغرضُ الكفاية.. ومَنْ ماتَ مَن اجنادِ المسلمين رُفِعَ الى زَوْجَتِهِ واولادِهِ الصغار قَدْرَ كفايتهم..)

واتە: وە پێویستە (گەورەی مسوڵمانان) ئەندازەی پێویستییان یانی هی یارمەتی وەرگران لەسەر جیهادو چەندە بەشیان دەکات بزانێ، وەئەوەی منداڵی هەبن لەبەر منداڵەکانی بۆی زیاد دەکرێ، هەروەها خاوەن ئەسپ لەبەر ئەسپەکەی بۆی زیاد دەکرێ.. وە دەبێ سەرنجی قیمەتی پێداویستییەکانیان بدات لە شارو شوێنەکانیان، چونکە نرخی شتان لەشوێنەکان جیاوازەو ئامانجیش ئەوەیە کەیارمەتییەکە بەشیان بکات.. وە هەرکەس لەجەنگاوەرانی مسوڵمانان مرد (یان کوژرا) ئەوە مووچەکەی تەسلیمی ژنەکەی و منداڵە نەباڵغەکانی دەکرێ، ئەندازەیەك کەبەشیان بکات..

جا بەرێزان لێرەش کۆتایی بەم خاڵی پێنجەمە دێنین و بەکۆتایی پێهێنانی ئەم خاڵەش کۆتایی بەم بابەتەی (شەهید) دێنین، بەچەند قسەیەك لەژێر ناوونیشانی (دوا قسەم)دا.

---

[100] بڕوانە: (المغني) لابن قدامة، ج٧ص ٣١٠، ٣١١، هەروەها لەمەزەبی حەنەفییەکان دا دەتوانی سەرنجی (فتح القدير) ج٦ص٦٧، وە لەمەزەبی مالیکییەکانیش دا سەرنجی (منح الجليل) ج٣ ص ١٨٥، بدەی، کەقسەکانیان زۆر لەیەکەوە نیزیکن.

## دوا قسـەم:

برایانی موجاهیدی بەڕێز! بێگومان باس و خواسی شەهیدان زۆر زیاتری دەوێ، چونکە بەڕاستی ئەوە کەئینسان لەڕێی خوای پەروەردگاردا گیانی خۆی بەخت بکات، لەوە بەخشندەییتر نابێت، وەك گوتراوە: (والجودُ بالروحِ مِنْ اعْظَمِ الجُودِ) واتە: بەخشندەیی بەبەخشینی ڕووح گەورەترینی کەرەم و بەخشندەیی یە.

وەبرایانی خۆشەویست! بێگومان ئەگەر کەسێك مسوڵمانیش بێت بەڵام لەژێر غەیری بەیداغ و عەلەمی ئیسلامدا بکوژرێ، هەرچەندە بیانووی نەزانین (العُذْرُ بالجَهْلِ)یشی لێ قبوول بکرێ هەر بەشەهید دانانرێ، یا ئەو مەبەستەی کە لەپێناویشیدا دەکوژرێ لەخودی خۆیدا هەق و ڕەواش بێ وەك بەرگریکردن لەنیشتمان و لەنەفس و لەماڵ و سامان و لەناموس، بەڵێ با مەبەستەکەیشی مەبەستێکی ڕەواو شەرعی بێ، مادام لەژێر ئاڵای غەیری ئیسلامدا بێت و لەژێر بەیداغی غەیری شەریعەتی خوادا بێت، ئەوە بێگومان نەك هەر بەشەهید دانانرێ، بەڵکو مەگەر بەهۆی نەزانینێکەوە[١٠١] کەعوزری هەبێ لەڕووی شەرعییەوە، دەنا لەڕاستیدا لەسەریشی گوناحبار دەبێت، بەڵام ئەگەر بێت و نەزانینەکەی پاساودار نەبێ و (مَعْذور بالجهل) نەبێ لەڕووی شەرعییەوە ئەوە بەدڵنیاییەوە هەرکەسێك لەژێر بەیداغی غەیری (لا الە الا اللە محمد رسول اللە)دا بڕوات بەهیلاك دەچێ و مەگەر چۆن دەنا بەکافرێتیش دەمرێ!، چونکە مسوڵمان بەندەی خوایەو دەبێ لەپێناوی دینی خواو تەنها لەژێر سایەی ئاڵایەکەیشیدا گیانەکەی بەخت بکات، ئەگەرنا لەپێناوی هەر شتێکی دیکەیدا بەخت بکات، دیارە ئەو شتەی وەك خوا یان لەخوا خۆشتر ویستووە، کەواتە بەندەی غەیری خوا بووە، وە مانای وایە شتێکی دیکەی پێ وەك دینی خوا وایەو شتێکی دیکەی پێ وەك خوا وایەو وەك پەرستراو

---

[١٠١] واتە: نەزانین (جهل)ەکەی لەوجۆرە بێت کەلەڕووی شەرعییەوە بۆی بەبیانوو (عُذر) دابنرێ.

(مَعْبود)ێك دەپەرستێ و بەندایەتی بۆ دەکات، ئەمەش بەلای کەمەوە هاوبەش بۆ خوا دانانی گەورە (الشرك الأكبر)یە کەخوا فەرموویەتی: نایبەخشم[١٠٢]!

خوای پەروەردگار سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات، خوا بەلوتف و کەرەمی خۆی پلەی شەهیدەکانمان بەرزو بەرزتر بکاتەوە، خوایە لەجیاتی ئێمە پاداشتی بەرزو گەورەیان بدەیەوە، وە خوایە هیدایەتی ئێمەش بدەی کە ئەو ڕێبازەی شەهیدان - هەر لەشەهیدانی بەدرو ئوحودەوە تاکو ئێستا کەهەموو پارچەو بەشەکانی نیشتمانی ئیسلامیی‌یان بەخوێنی خۆیان ڕەنگینیان کردوە - خوایە هیدایەتمان بدەی ئێمەش درێژە بەو ڕێبازە بدەین، وە خوایە هیدایەتمان بدەی کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ وە ڕێبازی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازیبێ دامەزراوو نەلەخشاو بین، وە پشتگیریمان بکەی کەلەژێر هیچ زەخت و فشارێکدا پاشەکشە نەکەین، وە ئیرادەمان کول نەبێ و چاومان نەترسێ و عەزممان شل نەبێ، خوایە لەو ئیماندارانەمان بگێڕی کەبەهۆی ئیمانەکەیانەوە بێجگە لەتۆ ترسی هیچ شتێك و هیچ کەسیان نیەو بێجگە لەتۆو پاداشتی تۆ دڵ بەهیچ شتێکی دیکە خۆش ناکەن وە بێجگە لەتۆ هیچ کەس و هیچ شتێك بەشایستەی ئەوە نازانن کە لەپێناویدا قوربانی بدەن و فیداکاری بکەن، ئامین.

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

والحمدلله رب العالمين

٦/صفر/١٤٢٣ك

١٨/٤/٢٠٠٢ز

بن پەڵك/ ئەحمەدئاوا












---

[١٠٢] (إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ انْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ...) (النساء:١١٦)

## نێوەرۆکی باسەکان

| لاپەرە | بابەت |
|---|---|

لەسەر ئەرکی هێزی سلێمانی
چاپکراوەو بڵاوکراوەتەوە



(وَالشُّهَدَاءُ عِنْدَ رَبِّهِمْ
لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ)





ژمارەی سپاردنی (٢٣٤)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ